پاڵەوانانی ئەنصار

-٧-

# عبداللّەی کوڕی ڕەواحە

(ڕەزای خوای لێ بێت)

نوسینی: ولید الأعظمي

وەرگێڕانی: حەمزە بەرزنجی

**پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموی:**

**(.........یـا معشـر الأنصـار، أفـلا ترضـون أن يـذهب الناس الى رحالهم بالشاة والبعير، وتذهبون برسول الله الى رحالكم، فوالذي نفسي بيده لو أن الناس سلكوا شعبا وسلكت الأنصار شعبا لسلكت شعب الأنصار، ولولا الهجرة لكنت امرأ من الأنصار، اللهم ارحم الأنصار وأبناء الأنصار وأبناء أبناء الأنصار).** رواه الأمام أحمد بن حنبل.

**واتە: ئەی کۆمەڵی ئەنصار، ئایا رازی نابن کە خەڵکی بە مەڕو وولاّغ و حوشتری غەنیمەتەوە برۆنەوەو ئێوەش پێغەمبەری خواتان(ﷺ) پیٚ بێت و بیبەنەوە، سوێند بەو زاتەی کە نەفسی منی بە دەستە ئەگەر هەموو خەڵك بە شیوێکدا برۆن و ئەنصاریش بە شیوێکدا برۆن ئەوا من شیوی ئەنصار دەگرمە بەر، وە ئەگەر لەبەر پایەی کۆچ کردن نەبوایە ئەوا من یەکێك دەبووم لە پیاوانی ئەنصار، خوایە رەحم بە ئەنصارو نەوەکانی ئەنصارو نەوەی نەوەکانی ئەنصار بکەیت.**

**ئەبو دەرداء (خوا لیٚی رازی بیٚت) دەفەرمویٚت:**

**( لقد رأيتنا مع الرسول(ﷺ) في بعض أسفاره في اليوم الحار الشديد حتى ان الرجل ليضع من شدة الحر يده على رأسه وما في القوم صائم الا رسول الله(ﷺ) وعبدالله بن رواحة).** الأستعاب..ج٣/٩٠١

**واتە: ئەبو دەردا دەفەرمویٚت: جاری وا دەبوو لە رۆژی زۆر گەرمدا لە هەندیٚك سەفەردا لە خزمەت پیٚغەمبەری خوادا(ﷺ) دەبوین، ئەوەندە گەرماكەی زۆر بوو پیاو لە تینی گەرمەیدا دەستی دەخستە سەر سەری، ئا لەو كاتەدا لە ناو هەمووماندا جگە لە پیٚغەمبەری خوا(ﷺ)و عبداللەی كوری رەواحە نەبیٚت رۆژووەوانیٚك نەبوو.**

## به ناوی خوا

عبداللـــەی کـــوری رەواحـــە(رەزای خـــوای لیٚ بیٚـــت) لـــە مەدینـــەی رووناکـــداو لـــە نـــاو نـــەوەی حـــارثی کـــوری خەزرەجـدا پیٚگـەیی، گـەنجیٚکی خـاوەن رەوشـت و بـە ئەدەب و شاعیریٚکی زمان پاراو و ووتە خۆش بوو.

شـــیعرەکانی بـــۆ هـــەڵنانی گەلەکـــەی بـــەکاردەهیٚناو پاریٚزگاری لیٚ دەکردن پیٚی، عبدالله زۆر زیـرەك و ووریـا بوو، هۆشیٚکی ساغ و بیریٚکی پاکی هەبوو، لەبەر ئەوە هەستی بـە تـاڵی ژیـانی دەکـردو ژیـانی بـە شـیٚوەیەکی چـەق بەسـتوو دەبینـی کـە هـیچ شـتیٚکی تیٚـدا نییـە تـا هەست و نەستی ببزویٚنیٚ.

کۆمـەڵیٚك لـە خـەزرەج لەگـەڵ پیٚغەمبـەری خـوا(ﷺ) لـە عەقەبەدا لە (منی) لە رۆژانی تەشریق کۆبونەوەو لەسـەر دەستی موسڵمان بوونی خۆیان ئاشکرا کردو ئیمانیان هیٚنا بە بانگەوازە نوییەکەی، وە کە گەرانەوە بۆ مەدینە مژدەیان دەدا بە کەس و کارەکەیان بەو ئیمان هیٚنانەیان و ئیسلام بونیان و دوور کەوتنـەوەیان لـە بت پەرستیو

باسـی هـەڵس و کـەوت و رەوشـت و زانیـاری پێغەمبـەریان(ﷺ) دەکـرد بـۆ گەلەکـەیان، هـەتا وای لێ هـات ئیسـلام لـەناو مەدینەشـدا بـڵاو بویـەوەو ئـەم دینـە چـووە نـاو چـەندەها دڵ و روونـاکی کـردەوە. لـە پێشڕەوەی ئەو کەسانەی کە سەرەتا موسڵمان بوون لـە نـاو مەدینـەدا: (عبداللـەی کـوری رەواحـە)ی شـاعیری شارەزاو هۆشمەند بوو.

عبدالله موسڵمان بوو وای لێ هات هەستی بە ئازادی و سەربەستیو کەرامەت و نرخە مرۆڤانەیی‌یەکەی دەکرد، هەستی بەو نـوورە دەکـرد کـە دڵ و هۆشـی داپۆشیبو و رۆشنی کردبویەوە، ئیتر ژیانی بە شێوەیەکی خۆش و جوان دەهاتـە پـێش چاوی، تـا وای لێ هـات کـە خـەڵکی بانگ دەکرد بۆ ئیمان و ئیسلام.

هەروەها بەشیری کوری سەعدی ئەنصاریش موسڵمان بـوو کـە مێـردی عـەمرەی کچـی رەوواحـەی خوشـکی عبدالله یە، هەروەها أبـو الـدرداء عمیری کوری مالك کـە خاڵۆزای عبداللەی کوری رەواحە بوو موسڵمان بوو، ئەم

خێزانـــه پێکـــەوه یارمـــەتی یـــەکیان دەدا لەســـەر بانگـەوازکردنی خـەڵکی بـۆ ئیسـلام و رزگارکردنیـان لـە گـومرایی، ئـەوه بـوو خـوای پـەروەردگار لەسـەر دەسـتی ئەمان چەندان کەسی لە گومڕایی دەرهێنا بۆ نـاو دینـی خۆی.

عبداللـە پـێش موسـڵمان بـوونی خوێنـدەوار بـوو و خوێندنـەوەو نوسـینی دەزانـی، بۆیـە هـەوڵی دەدا بـرا موسڵمانەکانی فێری خوێندنەوەو نوسین بکات،

لە کاتی وەرزی حەج کردندا موسڵمانانی مەدینە خۆیان ئامادەکرد بۆ سـەفەر کـردن بـەرەو مەککـەو حـەج کـردن، ئــەوە بــوو حــەفتا پیــاو لــە موســڵمان بــەرەو مەککــە ســەفەریان کــردو کەوتنــەرێ کــە لەناویانــدا عبداللــەی کــوری رەواحــەو بەشــیری کــوری ســەعدی مێــردی خوشـکەکەی تێـدابوو کـە ئـەم بەشیره بـاوکی (نوعمـانی کوری بەشیر)ی هاوەڵی پێغەمبەری خوایە(ﷺ).

پێغەمبەری خوا(ﷺ)لە رۆژانی تەشریقداو لـە (منـی) لـە عەقەبـەدا لەگـەڵ ئەنصـارەکاندا کۆبویـەوە، ئـەویش لـە

دوای نیـوەی شـەو، ئـەوانیش بەیعـەتیان پێـدا لەسـەر گوێڕایەڵی کردنـی لـە خۆشی‌و ناخۆشی‌دا، پێغەمبـەری خـواش(ﷺ) پـەیمانی لێ وەرگـرتن لەسـەر ئـەوەی کـە پارێزگاری بکـەن لـە خۆی‌و موسڵمانان لـە کاتێکدا کـە کۆچیان کـرد بـۆ لایـان، وە مژدەشـی دانـێ بە بەهەشت ئەگـەر ئـەو پەیمانـە بەرنـە سـەرو بـەوەفابن بەرامبـەری، پاشـان پێغەمبـەر(ﷺ) دوانـزە پێشـەواو نـەقیبی لێ هەڵبژاردن کە ببنە کەفیل بەسەر گەلەکەیانەوە لەبەردەم پێغەمبـەردا(ﷺ)، ئـەو ئەرکـەش جوبریـل(علیـە السـلام) پێـی هەسـتاو ئـەو شـەوە ئـەو دەسـت نیشـانی پێشـەواکانی دەکـرد بـۆ پێغەمبـەر(ﷺ)، وە پێغەمبـەری خوا(ﷺ) عبداللەی کوری ڕەواحەی هەڵبـژارد کـە ببێتـە پێشەوا بۆ بەنی حارثی کوری خەزرەج.

ئەوەبوو گەلەکەی ڕازی بوون پێـی و دواتـر کارەکانیـان هەموو دەگەڕانـدەوە بـۆ لای ئـەوو گوێیـان بـۆ بۆچوون و هەڵویسـتەکانی دەگـرت، بـەم شـێوەیە بـە دڵخۆشـی‌و کامەڕازی‌یـەوە گەڕانـەوە بـۆ مەدینـەو دەستیان کـرد بـە

بانگەوازکردن بۆ ڕێگای ڕاستی ئیسلام و چاوەڕوانی ئەو ڕۆژەیان دەکرد کە پێغەمبەر(ﷺ) دەردەکەوێت وماڵەکانیان ڕووناك دەکاتەوەو دێتە ناویان و دەیپارێزن و سەربەرز دەبن بە گەورەیی ڕێنموزنی‌یەکەی.
تا ئەوە بوو خوای گەورە منەتی خۆی ڕژاند بەسەر عبداللەی کوری ڕەواحەداو منداڵێکی بوو ئیتر ئەویش ناوی نا محمد بەسەر ناوی پێغەمبەری خوا(ﷺ)و لە خۆشەویستی ئەو، ئیتر خەڵکی عبدالله یان بانگ دەکرد (أبا محمد).

## مژدەدەرانی سەرکەوتن

پێغەمبەری خوا(ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینەو خەڵکی بەرەو پیری چوون بە خۆشی‌یەوەو بە ووتنی (الله اکبر) و (لا الـه الا الله) پێشوازیان لێ دەکرد، بە گەیشتنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) برایەتی خستە نێوان کۆچکەران و پشتیوانانەوە، ئەم کۆچ کردنەش بۆ مەدینە ڕق و تورەیی قورەیشی داگیرساندو پیاوانی قورەیش خەریك

**بـوو لــە توورەیی‌ـدا گڕیــان دەگــرت، چــونکە قــورەیش نەیدەویست ئیسلام بڵاوببێتەوەو هەواڵی بەناو خەڵکی‌دا بڕوات، لەبەر ئەوە دەستیان کرد بە هەڕەشەو گوڕەشە، لە کاتێکدا موسڵمانان لە مەدینەدا هەستیان بەو پەڕی خۆشی‌و کامەرانی‌و ئاسایش و دڵ ئارامی دەکرد لەگەڵ ئەوەی هەموو ماڵ و خانوو سەروەتیان بە جێ هێشتبوو لـە مەککـە کەچـی خۆیـان بـە دەوڵەمەنـد دەزانی‌ـو بـەو ئیمانــەوە کــە نــوورێکی شــاراوەی لــە دڵیانــدا دروســت کردبوو، قورەیش هەموو ماڵ و سامانیانی داگیرکرد بۆ خۆی‌ـو بەمـەش وازی نـەهێنا بـەڵکو بەربەستی لـە ڕێـی دینی خوادا دادەنا کە نەگات بە گەلانی عەرەب، جا ئایا موســڵمانان واز لــە قــورەیش دەهێــنن کــە بیــەوێت بــە ئــارەزووی خــۆی فەســادو بــەڕەڵایی لــە زەوی‌ــدا بڵاوبکاتـەوە؟! وەدژایـەتی خـواو پێغەمبەرەکـەی(ﷺ)و موسڵمانان بکات و ئەمانیش هـەر بێـدەنگ بن و هـەروا دانیشن؟**

لەو ماوەیەدا کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ هاوبەش دانەرەکان زیاتر رق و قینیان تاوی دەسەند، لە دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە مەدینە جێگیر بوو بیستی کەوا کاروانێکی قورەیش لە شامەوە دەگەڕێتەوە بۆ مەککە، لەبەر ئەوە کۆمەڵێك لە هاوەڵەکانی نارد بۆی، هاوەڵەکان دەرچوون بۆ ئەو کاروانە بە مەبەستی دەست بەسەراگرتن و تەمیٚ کردنی قەورەیش و زیان لیٚ دانی بە شێوەیەکی ئابووری بە هۆی پچڕاندنی ڕێگای شام لە کاروانیەکانی، لە پاش ئەوەی مونافیق و دووڕووەکان ئەم هەواڵەیان گەیاندبوو بە کاروانەکە، کاروانەکە ڕێگایەکی تری گرتە بەرو رزگاری بوو بەسەلامەتیو گەیشتەوە مەککە، کاروانچیەکان ئەم هەواڵەیان بە سەرۆکەکانی قورەیش راگەیاند ئەوانیش هەستیان بەو مەترسیە گەورەیە دەکرد کە هەڕەشە لە بازرگانیەکەیان دەکات، لەبەر ئەوە لە رق و تووڕەییدا خەریك بوو دەخنکان، بۆیە دەستیان کرد بە پیلان داڕشتن بۆ گرتنی مەدینەو هەموو هۆزو تیرەکانی نیوە

**دوورگەکەیان کۆکردەوەو بەرەو مەدینە کەوتنە ڕێ،** (يُرِيدُونَ لِيُطْفِؤُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ.....)، **بەلاّم سەرەنجام بە دۆڕاویو سەرشۆڕی گەڕانەوە** (....وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ) (٨) سورة الصف.

* * *

**پێغەمبەری خوا(ﷺ)دوای گەیشتنی ئەم هەواڵە پێی، بە خۆیو هاوەڵەکانیەوە لە مەدینە دەرچوون بۆ بەرەنگاریو تەمێ کردنی قورەیش و وەستاندنی لە سنووری خۆیو هەڵکەندنی ڕەگی خۆبەزلزانین و هەڵوەشاندنەوەوەی خەونەکانی. وە دەرخستنی درۆو دەلەسەکانیان بۆ خەڵکی، ئەمەش لە مانگی پیرۆزی ڕەمەزاندا رویدا لە ساڵی (٢)ی کۆچی.**

**سوپای قورەیش هەزار سەربازی شەڕکەر بوون کە پڕ چەك کرابوون و لەگەڵیاندا چەندەها وولاّغی زیادەیان پێ بوو، لە کاتێکدا هێزی موسڵمانان (٣١٣) سەرباز بوون کە حەفتا حوشترو دوو هێستریان پێ بوو کە**

هاوەڵەکان هەر سێ کەسەو بە نۆرە سواری حوشترێك دەبوون، هەتا هەردوو سوپاکە لە بەدردا بەیەك گەیشتن.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەرەتادا هانی هاوەڵەکانی‌دا لەسەر ئازایەتی‌و جیهادو دامەزراوی‌و ورەی بەرز دەکردنەوەو پێی دەفەرموون: ((والذي نفسي بيده لا يقاتلهم اليوم رجل منكم فيقتل وهو صابر مقبل غير مدبر الا أدخله الله الجنة)). واتە: سوێند بەو خوایەی نەفسی منی بەدەستە هیچ کەس نی‌یە لە ئێوە کە ئەمڕۆ جەنگیان لەگەڵدا بکات و ئارام بگرێت و بەرەو رووی دوژمن بوەستێت و پشت هەڵنەکات و بکوژرێت ئیلا خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە.

تا وای لێ هات گەرم و گوڕی و وورەو تامەزرۆی شەهیدی گەیشتە ئەو پەڕی لە ناو دڵی هاوەڵاندا بوون.

پاشان پێغەمبەری خوا(ﷺ) خۆی هەستا بەسەرکردایەتی کردنی سوپاکەی لە جەنگەکەدا بە دوعاو پارانەوەی سەرکەوتن لە خوای گەورە، هاوەڵەکانیش خێوەتێکیان هەڵدا بۆ پێغەمبەری

خـوا(ﷺ)، كـاتێ عبداللـەی كـوری رەواحـە پێغەمبـەری خـوای(ﷺ) بینـی چـۆن بـە كـوڵ لـە خـوا دەپاڕێتـەوەو هەڵدەلـەرزێت لێـی چـووە پـێش و فـەرمووی: ئـەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) خوای گەورە زۆر گەورەترە لەوەی بەڵێنەكانی باس بكەین. پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموی: ئەی كوڕی رەواحە ئایا چۆن باسی بـەڵێنی خـوا نەكـەم؟ خـوای گـەورە بەڵێنـەكانی هـەر دەباتـە سـەرو خیلافـی ناكات.

پاشـــان پێغەمبـــەری خـــوا(ﷺ) رووی وەرگێڕایـــە هاوەڵـەكانیو مـژدەی دانـێ بـە سـەركەوتن بەسـەر دوژمنانداو جێگەو شوێنی گلانی موشریكەكانی دیاری كرد كە لێرەدا فلأنە كەسیان دەكوژرێت و ...وە لێرەش یەكێكی تر ...وە لێرەش یەكێكی تریان دەگلێت..

جەنگ تەواو بوو بە سەركەوتنی موسڵمانان بەسەر بێ بڕوایانـدا وە موسـڵمانانیش حـەفتا لەسـەركردە رق لـە دڵـەكانی قورەیشیان كوشت و حـەفتا كەسیشیان لێ بـە دیل گرتن.

له كاتی جەنگیشدا خوای پەروەردگار مەلائیكەتی ناردە خواردەوە بۆ یارمەتی دانی موسڵمانەكان، هەتا پیاوێك لە هاوەڵەكان دەفەرموێت: من تیرەكەم دەگرتە یەكێك لە كافرەكان ئەمبینی كە پێش ئەوەی تیرەكەی بەربكەوێت و لیێی بدات دەكەوتە سەر زەوی. بۆیە دەمزانی ئەوەی كە كوشتی من نەبووم و یەكێكی تر بوو.

وە خوای گەورە بە هۆی مەلائیكەتەكانەوە ترس و دڵە راوكێی خستبوە ناو دڵی بێ بڕواكانەوە، وە كوژراوی موشریكەكان لەو شوێنانەدا كەوتبوون كە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەرەتای جەنگەكەدا دەست نیشانی كردبوو كەسیان شوێنەكانیان بە بۆشی نەمابویەوە.

ئەمەش یەكێك بوو لە موعجیزەكانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) كە ئیمان و باوەری لە دڵی هاوەڵەكانیدا زیاد كرد بە پێغەمبەرێتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و وورەو ووزەیەكی زیادو ئازایەتییەكی زیاتری پێ بەخشین بۆ خەبات كردن لە خزمەتیداو كۆڵنەدان لە تێكۆشان لە گۆڕەپان بۆ دەستەبەركردنی یەكێك لە دوو ئامانجە

چاکەکە: یـان سـەرکەوتن وە یـان شـەهیدی، کـە هـەر یەکێکیان بگری خێری تێدایە.

عبداللـەی کـوری ڕەواحـەش یـەکێك بـوو لـەو پاڵەوانـە ئازایانەی کە ڕۆژی بەدر لـەو تاقیکردنەوەیـەدا دەرچوو، وە لـە کـاتی تـەواو بـوونی جـەنگ پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) ناردی بۆ مەدینـە کـە مـژدە بـدات بـە کـەس و کاریـان لـە بەشە بەرزەکانیو سـەرەوەی شـار بـەو سـەرکەوتنەی کـە خوای گەورە کردی‌یە خـەڵات بۆ پێغەمبـەری خـوا(ﷺ)و موسڵمانان.

عبداللــە ش سـواری حوشـترەکەوی بـوو دەرچـوو بـۆ گەیانـدنی فەرمانەکـەی پێغەمبـەر(ﷺ) هـاوڕێ لەگـەڵ زەیـدی کـوری حـارث کـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) حوشترەکەی خۆی دایەو ناردی کە مژە بدات بە کـەس و کاریـان لـە بەشـی خـواروو نزمایی‌یـەکان. هـەردوکیان دەرچـوون هـەتا گەیشـتنە قـەراغی شـاری مەدینـە لـە چێشـت هـەنگاوی ڕۆژی شـەممەی (١٩) ی ڕەمـەزان و لـەوێوە عبداللـەی کـوری ڕەواحـە لی‌ـی جیـا بوویـەوەو

بەرەو رووی شوێنە بەرزەکان لە لای باکورەوە کەوتە ڕێ، بە هەموو توانای خۆی بەسەر حوشترەکەیەوە هاواری دەکرد: (ئەی کۆمەڵەی ئەنصار موژدەبێت لێتان پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەلامەتەو موشریکەکان کوژراون و بەدیل گیراون، لە کوژراوەکانیاندا دوو کورەکەی رەبیعەی تیایەو دوو کوڕەکەی الحجاج و ئەبو جەهلیش کوژراون لەگەڵ زەمعەی کوری ئەسوەدو ئوممەییەی کوری خەلەف، وە سوهەیلی کوری عەمروی (ذو الأنیاب)یش لە ناو دیلەکاندایە لەگەڵ کۆمەڵێك دیلی زۆر).

عاصمی کوری عەدی دەفەرموێت: هەستام و بەرەو پیری چووم و ووتم ئەوە بەراستیتە ئەی کوری رەواحە؟ عبدالله فەرموی: ئەرێ سوێند بە خوا، وە سبەینێ إن شاء الله پێغەمبەری خوا(ﷺ)و هاوەڵەکانی دەگەنەوە ئێرەو دیلەکانیشیان پێیە بە کۆت کراوی.

پاشان عبداللە دەستی کرد بە موژدەدان بەماڵە ئەنصارەکان لە بەشی سەرەوە کە ئەوانیش بریتی بوون

له وائیل و بەنو عەمروی کوری عەوف و خةطمة. ماڵ بە کاڵ مژدەی سەرکەوتنی پێ دەدان و منداڵەکانیش بە دوایدا بە دەم راکردنەوە دەیانووت: ئەبو جەهلی فاسق کوژرا، پاشان ئەنصارەکان هەموویان کۆبوونەوە لە نوێژگە (مصلی) دواتر دەرچوون بۆ (الروحاء) بۆ بەرەو پیرچوونی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، وە پیرۆزبایی ئەم سەرکەوتنەیان لێ دەکرد.

## شاعیری ئیسلام

عبداللەی کوڕی ڕەواحە یەکێك بوو لە شاعیرەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، وەیەکێك بووە لەوانەی کە پارێزگاریان دەکرد لە پێغەمبەر(ﷺ)و موسڵمانان. کوڕی ڕەواحە بەرپەرچی بێ باوەڕانی دەدایەوەو درۆکانی هەڵدەماڵین و گاڵتەی بە نەزانی و گومڕاییان دەکردو شیعری بەسەر ئیسلام و پڕۆگرامەکەیدا دەوت.

پێغەمبەری خوا(ﷺ)بۆ هەموو شوێنێك چەكی تایبەتی بەكاردەهێنا كە بۆی بلویٚ وچاك بێت بۆی و بۆ هەموو شوێنێك پیاوی دەخستە ناوی.

وە لەسەرووی هەموو شاعیرەكانەوە سیان هەبوون: عەبدڵڵای كوڕی ڕواحە، وە حەسانی كوڕی پابت و كەعبی كوڕی مالیك. كەهەمووشیان ئەنصاری بوون.

حەسان و كەعب بەرپەچی موشریكەكانیان دەدایەوە بەقسەپیٚ وتن و گاڵتە پێكردن هەڵوێستە ناشیرینەكانیان دەردەخست لە غەدرو دەست درێژیو وەفا نەكردن بەپەیمان و ......هتد.

بەلاّم عبدالله كوڕی ڕەواحە زیاتر باسی خراپی موشریكەكانی دەكرد لە كوفرو كافربونیان بەخواو بت پەرستنیان و زیناكردن و ئەنجامدانی حەرامەكان.

موشریكەكانیش بەگشتی و شاعیرەكانیان بەتایبەتی پێیان وابوو كە شیعرەكانی حەسان و كەعب زۆر لەسەریان قورسترە وەك لەشیعرەكانی عبدالله. بەلاّم كە خوای گەورە هیدایەتی دەدان و بەچاكی موسڵمان

دەبوون ئەو کاتە هەستیان دەکرد کە شیعرەکانی کوڕی ڕواحــە زۆر بــەهێزترە لەســەریان وەك لــە شــیعرەکانی حەسان و کەعب.

عبداللــە زۆرێــك لەشــیعرەکانی بەســەر پێغەمبــەری خوا(ﷺ)دا ووتوەو پێغەمبەریش (ﷺ)بە چاکی دادەناو دەست خۆشی لێ دەکردو بۆی دەپاڕایەوە.

(عەروەی کوڕی زوبێر ) دەڵێت :

(شـیعری هـیچ کەسم نەبیسـتوە ئەوەنـدەی شـیعرەکانی عبداللــە کــوڕی ڕەواحــە بــەخێرایی و بــە جەریئییــەوە وتبێتی )

عبدالله کوڕی ڕەواحە دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

چـوومە نـاو مزگـەوت و بینـیم پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) دانیشــتووە لــە سوچــێکی مزگەوتــداو کۆمــەلێکی زۆر لەهاوەڵان بە چواردەوریەوەن، کە منیان بینی هاواریان کرد: عبداللـە کوڕی ڕەواحـە.. عبداللـە کـوڕی ڕەواحـە.. منیش هەستم کرد کە پێغەمبەر(ﷺ)بانگی کردم. بەرەو لایان ڕۆشتم و سەلامم لێ کرد فەرموی: دابنیشە لێرە.

منـيش لـه بەردەمیـدا دانیشـتم .ئینجـا فـەرمووی :چـۆن شـيعر دەڵێیـت گــەر بتــەوێت بیڵێیــت؟ وەکــو بڵێیــت بەلایـەوە سـەیربوو. ووتم: سـەیری ئـەو شـتە دەکـەم و بــیری لێ دەکەمـــەوەو شـــیعرەکەی بـــۆ هەڵدەبەســـتم .فەرمووی دەی باسی موشریکەکان بکە.
ئــەلێ.... منــيش هیچــم ئامــادە نــەکردبوو بۆیــە بــیرم کردەوەو بەشیعرەوە ووتم:

أني تفرست فيك الخير أعرفه
والله يعلم أن ما خانني البصر
أنت النبي ومن يحرم شفاعته
يوم الحساب لقد أزرى به القدر
فثبت الله ما اتاك من حسن
في المرسلين ونصرا كالذى نصروا

پێغەمبـەریش (ﷺ)فـەرمووی تـۆش ئـەی کـوڕی ڕواحـە خودا دامەزراوت بکات.

عبدالله بەشداری جەنگی (ئوحد)ی کرد. وە لەم تاقیکردنەوەیەشدا سەرکەوت و دوژمنانی ئیسلامی ڕاچڵەکاندو بە باشی دەوری خۆی بینی بە شمشێرو زوبانی. ئەوەبوو دوای تەواو بوونی جەنگەکە دەستی کرد بە گریان بۆ پێشەوای شەهیدان (حەمزە) وە ئەی ووت:

بكت عيني وحق لها بكاها
وما يغني البكاء ولا العويل

على أسد الإله غداة قالوا
أحمزة ذاكم الرجل القتيل

أبا يعلى لك الأركان هدت
وأنت الماجد البر الوصول

عليك سلام ربك في جنان
مخالطها نعيم لا يزول

ألا ياهاشم الاخيار صبرا
فكل فعالكم حسن جميل

رسول الله مصطبر كريم
بأمر الله ينطق اذ يقول

**ألا من مبلغ عني لؤيا**

**فبعد اليوم دائلة تدول**

**وقبل اليوم ماعرفوا وذاقوا**

**وقائعنا بها يشفى الغليل**

**نسيتم ضربنا بقليب البدر**

**غداة أتاكم الموت العجيل**

**غداة ثوى أبو جهل صريعا**

**عليه الطير حائمة تجول**

**وعتبة وابنه خرا جميعا**

**وشيبة عضه السيف الصقيل**

**ومتركنا أمية مجلعبا**

**وفي حيزومة لدن نبيل**

**وهام بني ربيعة فاسألوها**

**ففي أسيافنا منها فلول**

**وە لە كاتێكدا كە (بەنو عامر) ئەو غەدرەیان لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) كرد لە (بئر معونە)دا. كە لەناو**

شــەهیدەکاندا(نافعی کــوڕی بــەدیلی کــوڕی وەرقــائی ئەلخەزاعی) تیابوو. بۆیە عبدوڵلاً بۆی دەگریاو دەیوت:

رحم الله نافع بن بديل

رحمة المبتغي ثواب الجهاد

صابر صادق وفي اذا ها

أكثر القوم قال قول السداد

وەپێغەمبــەری خــودا (ﷺ)فــەرمانی کــرد بــە تــەمێ کردنی(بني النضير) لە کاتێکدا پەیمان و بەڵێنەکەیان هەڵوەشاندەوە. وەئەمری کرد بە کوشتنی(کەعبی کوڕی ئەشرەف)ی دوژمنی خوا. لەبەرئەوە عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحــە زۆر دڵخــۆش بــوو بــە کوشــتنی کــەعب و ئــەم شیعرەی هەڵبەست:

لعمری لقد حكت رحى الحرب بعدها

أطأرت لؤيا قبل شرقا ومغربا

بقية آل الكاهينين وعزها

فعاد ذليلا بعدها كان أغلبها

فطاح سلام وأبن سعية عنوة

وقيد ذليلا للمنايا ابن أخطبا

وأجلب يبغي العز، والذل يبتغي

خلاف يديه ماجني حين اجلبا

كتارك سهل الأرض والحزن همه

وقد كان ذا في الناس أكدي واصعبا

وشأس وعزال وقد صليا بها

ما غيبا عن ذاك فيمن تغيبا

وعوف بن سلمى وابن عوف كلاهما

وكعب رئيس القوم حان وخيبا

فبعدا وسحقا للنضير ومثلها

ان اعقب فتح أو ان الله اعقبا

جەنگی ئوحود لە مانگی (شەوالی )ساڵی( ٣)کۆچیدا کۆتایی هات و ئەبوسوفیانیش پەیمانیدا بە موسڵمانان کە دەبێ ساڵی داهاتوو لە بەدردا پێیان بگاتەوەو بەرەنگاریان بوەستێ، وە کاتێ کە کاتی پەیمانەکەی

هات پێغەمبەر(ﷺ) بە هاوەڵەکانیەوە دەرچوون بۆ ئەو پەیمانەی کە ئەبوسفیان وتبوی. ئەوەبوو لە بەدردا هەشت(٨ )شەو مانەوەو چاوەڕوانی ئەبوسوفیانیان دەکرد لەگەڵ سوپاکەی قورەیش. ئەبو سوفیانیش لەو کاتەدا بەخۆیو سوپاکەیەوە لە مەککەوە بەرەو مەدینە کەوتبوە ڕێ. لە کاتی ڕۆشتنیدا وای بە باش زانی کە بگەڕێتەوەو شەڕنەکات. ئەوەبوو گەڕانەوە بۆ مەککەو شەڕی لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) نەکرد. پێغەمبەریش (ﷺ) گەڕایەوە بۆ مەدینە.

لەو کاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) عەبدوللاّی کوڕی ڕەواحەی کردبووە ئەمیری مەدینە. بۆیە کاتێ کە گەڕایەوە ئەم هۆنراوەیەی هەڵبەست :

وعدنا أباسفيان بدرا فلم نجد
لميعاده صدقا وان كان وافيا

فاقسم لو وافيتنا فلقيتنا
لأبت ذميما وافتقدا المواليا

تركنا به اوصال عتبة وابنه
وعمرا ابا جهل تركناه ثاويا

عصيتم رسول الله أف لدينكم

وامركم السيء الذي كان غاويا

فأني وان عنفتمونى لقائل

فدى لرسول الله أهلي وماليا

اطعناه لم نعد له فينا بغيره

شهابا لنا في ظلمة الليل هاديا

كاتێك خواى گەورە ئەم ئايەتەى ناردە خوارەوە لە سورەتى (ألشعراء) :

﴿وَالشُّعَرَاء يَتَّبِعُهُمُ الْغَاوُونَ(٢٢) أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِي كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ(٢٢٥) وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ(٢٢٦) إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَذَكَرُوا اللَّهَ كَثِيراً وَانتَصَرُوا مِن بَعْدِ مَا ظُلِمُوا وَسَيَعْلَمُ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَيَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ﴾ ٢٢٤–٢٢٧.

واته:(شاعيرەكان گومڕاكان شوێنيان دەكەون و شيعرەكانيان پرە لە درۆو دەلەسە، نايانبينى كە چۆن هەمو ڕێگايەكى درۆ دەگرن– وەكردەوە بەو قسانە

ناکـەن کـە دەیڵـێن- جگـە لـەو ئیمانداران‌ـە نـەبێ کـە کـردەوەی چـاکەدەکەن ویـادی خـوا زۆر دەکـەن و بـە شـیعرەکانیان دینـی خواسـەردەخەن... وەسـتەم کـارە موشـریکەکانیش دەبینینـەوە چ چارەنوسـێکی رەش دەیانگرێتەوە.

بەپەلە عەبدوللآی کوڕی ڕواحەو حەسسانی کوڕی ثابت و کەعبی کوڕی مالیك سیٚ کەڵـە شاعیرەکە بە گریانـەوە هاتنە خزمەتی پیٚغەمبەر(ﷺ) ووتیان :

سـوێند بـەخوا خـوا نـاوی بـردوین و ڕووڕەش و (فَضحی)کردوین. پیٚغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:

(نەخێر ئەی عبدالله ....نەخێر ئەی حەسان .... نـەخێر ئەی کەعب... وَالشُّعَرَاء يَتَّبِعُهُمُ الْغَاوُونَ(٢٢٤) أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِـي كُـلِّ وَادٍ يَهِيمُـونَ(٢٢٥) وَأَنَّهُـمْ يَقُولُـونَ مَـا لَـا يَفْعَلُـونَ(٢٢٦) إِلَّـا الَّـذِينَ آمَنُـوا وَعَمِلُـوا الصَّالِحَاتِ......(ئەمانـەی کـە ئەفـەرمویٚ جگـە لەوانـەی ئیمانیان هەیە و هتد... واتە: ئێوە....)

ئەوەبوو دوای ئەوە عبدالله بەخۆشحاڵی و بە دڵخۆشیو دڵ ئارامیەوە دەستی کردەوە بەشیعرە نەمرەکانی بەسەر ئیسلامدا. تاوای لێهات بەهۆی ئەم کارەوە ڕەفتاری جوانی لە ناو خەڵکیدا بڵاوکردەوەو باسی ئەو ڕۆژانەی خۆی دەکرد بە هەمو دڵسۆزی و ئەمانەتێکەوە.. تا ئەم بەرهەمە نایابەی بۆ بەجێهێشتین لە ئەدەبی پاك و ساغی ئیسلامی ...

## گەڕانەوە بە پیادەیی

پێغەمبەر(ﷺ)بەرەو (المریسیع) بەرێ کەوت بۆ لێدانی (بنی المصطلق)و جەنگین لەگەڵیان. وە لەکاتی گەرانەوەیدا بۆ مەدینە لە نیوەی شەودا لە (العقیق)دابەزیو ئەیویست بە ڕۆژ بچێتە ناو مەدینە.

جابری کوڕی عبداللەی ئەنصاری ئەڵێ: من لەگەڵ عبدالله کوڕی ڕەواحەدا بووم لە جە نگی (المریسیع).

وەکاتێ گەڕاینەوەو تەواو بوین، لە(وادی العمیق) دابەزین لە نیوە شەودا. لەو کاتەدا خەڵکی لە

وڵاخــەکانیان دادەبــەزین و دەچــوون بــۆ خــەوتن و پشودان.

ووتمان: کوا پێغەمبەری خوا(ﷺ) ؟

ووتیان: لە پێشەوەی خەڵکەکەدایەو خەوتووە .

عبداللـە کـوڕی ڕەواحـە پـێ ی ووتم: ئـەی جـابر بۆچـی پێشــی خــەڵکی نەکــەوین و لــە پێشــی هەموویانــەوە نەچینەوە ناوماڵەوەمان ؟

منـیش ووتم: ئـەی بـاوکی محمـد. نامـەوێ پێچـەوانەی کەس بکەم. کەس نابینم پێش کەوتبێ.

عبداللـە فـەرموی: سـوێند بـە خـوا پیغەمبـەر نـەهی لێ نـە کردوین لەپێش کەوتن .

ووتم: بەڵام من هەر پێش ناکەوم ...

جابیر دەفەرموێت:

(عبدالله خواحافیزی لێ کردم ودەرچوو بەرەومەدینە. لـە دواوە سەیرم دەکرد لەسەر ڕێگا کەسی لەگەڵ نەبوو.)

جــابیر دەفەرموێت:(ئــەوە یەکــەم شــتێك بــوو کــە پێغەمبــەر(ﷺ)نــەهی لێ کــرد. وەهــیچ شـتێکم نـەبینیوە

هێنــــدەی ســــەربازگەو پەیوەســــت بــــوون بەکۆمــــەڵ و(جەماعە)چاك بێت).

وەسوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) وەهابوو ئەگەر لە سەفەر یان لە جەنگ بگەرایەتـەوە بەشـەو نەدەگەرایـەوە ناومەدینـە. بــەڵکو لــە چــواردەوری شــاردا خەیمــەی هــە ڵــدەداو ســەربازگەی دادەنــاو یــەکێکی دەنــارد بــۆ هــەواڵ دان بەخەڵکی کە پێغەمبـەر(ﷺ)گەراوەتـەوە. ئـەوەیش لەبـەر ئـەوەی کـە خـەڵکی لـە پـڕ ڕانەچڵەکێو خـەویان لێ تێـك نەچـێت بێنــە دەرەوە بەشــەو بــۆ پێشــوازی لێ کردنــی، بـەڵکو بـەڕۆژ دەچـووە ناوشـار لـە کاتێـکدا کـە خـەڵکی خۆیان ئامادەکردوەو شاریان پاکەوە کردوەو ئاوڕشێنی جادەوشـەقام و ڕێگـاو بانـەکانیان کـردوەو جل و بـەرگی جوانیان لەبەر کردوە بۆ پێشـوازی کـردن لـە پێغەمبـەری خۆشەویست (ﷺ).

# خواردنی کۆمەڵی خەندەق

دوژمنـــانی ئیســـلام هـــەوڵ و کۆششـــیان زیـــادکرد لـــە (جولەکـەو مونـافیقین و هاوبـەش دانـەران) بـۆ دژایـەتی کردنـی دینـی خـواو شـوێن کـەوتوانی. لەبەرئـەوە ئـەم هێزانـە کۆبونـەوە دژی ئیسـلام و بـەرەو ڕوی مەدینـە شـاڵاویان هێنـا، لەگـەڵ خۆشـیاندا هۆزەکانی(غـەطەفـان وفـــەزارەو غـــەیری ئەوانیشـــیان)هێنابوو لـــە عەرەبـــە دەشتەکییەکان.

ئەمـــە پێغەمبـــەری خـــوای(ﷺ)ناچـــارکرد کـــە لەگـــەڵ هاوەڵەکانیدا خەنـدەقێکی گـەورە هەڵبکـەنن ومەدینـەی لـە دوژمنـان پـێ بپـارێزن .هاوەڵـانیش ڕەزای خوایـان لێ بێـت زۆر بـە گـەرم وگوڕیـو لێ بـڕان و دڵ سـۆزی یـەوە ئـــەرکی سەرشـــانیان بـــەجێ دەهێنـــا لـــە هەڵکەنـــدنی خەندەقەکـە .پێغەمبـەری خـواش(ﷺ)خـۆی هـەڵ دەسـتا بەهەڵکەنـــدنی لەگەڵیانـــداو هـــانی دەدان و دوعـــای بـــۆ دەکـــردن . هاوەڵـــەکانیش بـــە وێنـــەی کـــوڕانی ڕۆژی میحنـەتی تێکـڕای ڕۆژیـان تـەرخان کردبـوو بـۆ کـارکردن

تیایـــداو شــەوان دەگەرانــەوە نــاوخێزان و ماڵــەکانیان! بەڵام هــەبوو شــەوو ڕۆژ بـە درێـژایی کـات کـاری دەکـرد تیایدا!!

هاوەڵــە ئازیزەکــانی پێغەمبــەری خــوا(ﷺ)بــە هــەزاران ڕەزاو رەحمــەتی خواتــان لەســەر . بــە ڕاســتی ئێــوە شایســتەو پیـاوی بەهەشـتن . بەڕاسـتی ئەوئایەتـەی کـە بۆتــان دابــەزی:﴿...رضــي الله عــنهم ورضــوا عنــه...﴾ قــابیلی خۆتانــە، ئێـوە بـەو هەوڵـەتان بەهەشـتان کـڕی. بەڵام نازانم ئێمەی فەریکە موسڵمانانی سەدەی بیستەم چی بکەین؟! چۆن خۆمـان بـە شـوێنکەوتەی ئـەو ڕێبـازە بـزانین کـە ئێـوەی لەسـەربوون . لـە کاتێکـدا دارێکمـان نەخستۆتە سەر بەردێك بۆ خوا.

ئەوەنـــدەمان لەســـەرە.. ئەوەنـــدە دەتـــوانم بڵـــێم... پەروەردگار لەباخـەکانی بەهەشـتا بەدیـداری ناوچاوانی جوانی ئەو هاوەڵە بۆ خـوا سـوڵحاوە ئیمانیانـە شـادمان بکە.....آمین...

ئەمـە هەڵوێسـت و کـاری موسـڵمانانی راسـتەقینە بـوو. بەڵام دووڕووە مونافیقەکان خۆیان لەم کارە ئەدزیـیەوە بەچەندەها بەهانەی درۆ. کەئەمەش سیفەتی مونافیقانـە لەهـەموو سـەردەم و شـوێنێکدا. بـەم جـۆرە هەڵکەنـدنی خەندەق بیست(٢٠) ڕۆژی خایاند.

لــە یــەکێك لەڕۆژەکانــدا کــە پێغەمبــەر(ﷺ) لەگــەڵ هاوەڵەکانیــدا خــەریکی هەڵکەنــدنی خەنــدەق بــوون. منـداڵێکی بینـی کـە لـە لوێچێکی کراسـەکەیدا شـتێکی هـەڵگرتبوو. پێغەمبـەر(ﷺ) بـانگی کـردو لێـی پرسـی: ئەوە چییە لەکراسەکەتدا ؟

ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خـوا(ﷺ)ئەمـە خورمایـەو دایکــم کــە ناوی(عــەمرەی کچــی ڕەواحە)یــە بەمنــدا نـاردویێتی بـۆ بـاوکم کـە ناوی(بەشـیری کـوڕی سـەعد)ە لەگەڵ(عبداللــەی کــوڕی رەواحــە)ی خــاڵم تــا بیخــۆن. پێغەمبــەری خــوا(ﷺ)عەباکــەی داکەنــدو فــەرمانی بــە منداڵەکـە کـرد کـە خورماکـە بەسـەر دەسـتیدا بڕژێنێتـە سەر عەباکەی.

منداڵەکەش خورماکەی ڕشت.. تاوای لێ هات خورماکە لـــــە نێـــــوان هـــــەردوو دەســـــتی پـــــیرۆزی پێغەمبەرەوە(ﷺ)دەباری بەسەر عەباکەیدا تاپڕبوو بە جۆرێـك نەیـدەگرت و هـەردەباری یـە سـەر عەباکـەو بـەم لاولایدا دەڕژا..

پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە یەکێك کە کۆمەڵی خەندەق بانگ بکات و بڵێ:(وەرن نانەکەتان بخۆن)..

هەموو کۆمەڵی ئەهلی خەنـدەق کۆبوونـەوە کـە زیاتر لـە ســێ هــەزار (٣٠٠٠) پیــاو دەبــوون .هــەموویان لــەو خورمایەیان خوارد تا تێربوون، دوایی کەسەیری دەکەن دەبینن هیچی لێ کەم نەکردووە.!!

ئەم موعجیزەیـەی پێغەمبـەر(ﷺ)کارێکی گـەورەی کـردە ســەر دڵــی هاوەڵــان و زیــاتر هانیــدان لەســەر کــارو قوربانیدان، و جـۆش و غیرەتـی زیـاتری لـەناو دڵیانـدا دروست کرد.

ئــەو بیســت ڕۆژەی کــە هاوەڵــەکان تیایــدا مانــەوەو خـەریکی هەڵکەنـدنی خەنـدەق بوون خۆشترین ڕۆژانێك

بوو بەلایانەوە لەگەڵ ئەو هەموو نارەحەتی‌و ترس و ئازارو ماندوو بونەشدا .

ئەوەش لەبەر ئەوە بوو کە ئەم پیاوانە زۆر پەیوەست و پەیوەندی خۆشەویستی‌یان بە پێغەمبەرەوە (ﷺ)هەبووە. هەموو رۆژێك كە لە دە (١٠) سەعات کەمتر نەبوو کاریان تێدا دەکرد .لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەواڵی پێگەیشت کە (بەنی قورەیزە)لە جولەکەکان پەیمان وبەڵێنەکەیان هەڵوەشاندۆتەوە لەگەڵ پێغەمبەرداو (ﷺ)یارمەتی موشریك و مونافق و عەرەبەکانیان داوەو پشتیان گرتوون. پێغەمبەریش (ﷺ) ویستی ڕاستی ئەم هەواڵەی بۆ دەربکەوێ، لەبەرئەوە چوار کەس لە هاوەڵەکانی نارد بۆ (بەنی قوڕیزە) کەئەمانە بون:

(سەعدی کوڕی عوبادە،- سەعدی کوڕی مەعاز- عبداللەی کوڕی ڕەواحە- خەواتی کوڕی جوبەیر )وە فەرمانی پێکردن کە ڕاستێتی ئەو هەڵوێستەی (بەنی قوریزە)یان بۆ دەربکەوێ لە پەیمان شکاندن یان

پشــت تێكــردن، وەفەرمانیشــی پێكــردن ئەگــەر (بــەنی قوریزە)لەســەر پەیمانەكــەی خۆیــان مابوونــەوە ئــەوا بەئاشـكرا ئـەم هەواڵـە بڵاوبكەنـەوە. بـەڵام ئەگـەر بینیـان كە(بـــەنی قوریزە)غـــەدریان كـــردوەو پەیمانەكـــەیان هەڵوەشـاندۆتەوە ئـەوا بەئاشـكرا بڵـاوی نەكەنـەوەو بـە جفرەو نهێنی هەواڵەكەی پێبڵێن، ئەمەش لەبەر ئەوەی كـــە نـــەوەكو هاوەڵـــەكان بـــەم هەڵوێســـتەی (بـــەنی قوریزە)پشـتیان سـاردبێتەوەو وورەیـان كـەم بێتـەوە. ئەوەیە ڕێك و پێكیو نەخشەدانان لەكاری ئیسلامیدا. نـەك ئـاژاوەگێڕیو بـێ سـەروبەری.. بـەڵكو كـاری دینـی خوا پێویستی بە دانایيو لێزانیو ڕێك و پێكی هەیە.
چوار هاوەڵەكەش گەیشتنە (بەنی قوریزە)و بینیان كە پەیمانەكـەیان زۆر بـە سـەختی شـكاندوە. ئـەوەبوو كـە گەڕانــەوە بــۆلای پێغەمبــەری خــوا(ﷺ) پێیــان ووت: (عضـل والقـارة){ بەمـەش ئاماژەیـان كـرد بـۆ ڕووداوی جـەنگی (بنــی لــەحیان )لــە شــوێنی ئــاوی (الرجیـع)و غەدری موشریكین بەرامبەر (خوبەیبی كوڕی عەدی )و

هاوەڵـــەکانی بەدەســـتی ئـــەو دوو هـــۆزە،–کەواتـــە مەبەستیان ئەوەبوو ئەمانیش غەدریان کرد وەك ئەوان.}
پێغەمبەری خواش (ﷺ) لە مەبەستەکەیان تێگەیشت.
لـــە پاشـــاندا (هاوبـــەش دانـــەران و جولەکـــەکان و عەرەبەکان) چواردەوری مەدینەیان داو نزیکەی مانگێك ئابلۆقـەیان خسـتە سـەر ئـەو شـارەو ڕێگـەیان نـەدەدا خـواردن بچـێتە نـاوی. بـەڵام هاوەڵـان بەدامەزراوی‌یـەوە لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ)مانەوە. بەئارامگری‌یەکی زۆر بێ وێنـەوەو دووراو دوور قسـەیان بەموشـریکەکان ئـەوت و چـــاوەروانیان ئـــەکردن هـــەتا خـــوای گـــەورە ئـــەم ناخۆشی‌یەی لەسەر هەڵگرتن و بایەکی هێنا کـە خێمـەو دەواری موشـریکەکانی هەڵـداو ئاگرەکـانی کوژاندنـەوەو توانای لێبڕین ..﴿ وَرَدَّ اللَّهُ الَّذِينَ كَفَرُوا بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُوا خَيْـراً وَكَفَـى اللَّــهُ الْمُــؤْمِنِينَ الْقِتَــالَ وَكَــانَ اللَّــهُ قَوِيّــاً عَزِيزاً﴾.ألاحزاب /٢٥

## خورما بەشکەری خەییەر

عبداللەی کوڕی ڕەواحە دووجار جەنگی لە خەیبەردا کرد پێش ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ)جەنگیان لەگەڵ بکات، جاری یەکەم لە مانگی ڕەمەزاندا بوو لە ساڵی شەشی (٦)ی کۆچی کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ سێ هاوەڵدا ناردی بۆ خەیبەر تاهەواڵی خەڵکەکەی بزانێت و بزانێ چیان دەوێ و باسی چی دەکەن وەهەواڵی (ئەسیری کوڕی زارم )ی دوژمنی خوا کە یەهوودی بوو بزانێ.

عبدالله گەیشتە (خەیبەر )و چووە ناو باخ و باخاتەکانی، سێ هاوەڵەکە بلاْوبوونەوەو تەوزیع بوون لەکون و کەلەبەرەکانیدا تاهەموو دەنگ و باسێکی (خەیبەر)یان زانیو بۆیان دەرکەوت چیان دەوێ و چیان داناوە لە فێڵ و پیلان و تەڵەکە بۆ ئیسلام و پێغەمبەر(ﷺ). جولەکەش بەم مەسەلەی ئەمانی نەزانی. عبدالله ش لەکۆتایی مانگی ڕەمەزاندا گەڕایەوە بۆ مەدینە لەگەڵ هاوەڵەکانیداو هەموو هەواڵەکانی بە

**پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕاگەیاند لە دەنگ و باسی یەهوودیەکانی خەیبەر ..**

**(ئەسیری کوڕی زارم )پیاوێکی ئازاو غەدرکەری کاول کەربوو. کاتێك (أبورافعی یەهودی )کوژرا یەهود (ئەسیری کوڕی زارم)یان هەڵبژاردو کردیانە سەرکردەو پێشەوای خۆیان. لەوکاتەدا(ئەسیر) هەموو یەهودی کۆکردەوەو ووتارێکی بۆ دان و ووتی:(سوێند بەخوا هیچ کاتێك محمد نەچووە بۆلای یەکێك لە یەهوودییەکان ئیلا یەکێك لەهاوەڵەکانی بۆ ناردووەو تا توانیویەتی لێی کوشتوون، بەڵام من شتێك ئەکەم کە هاوەڵەکانم واتە یەهوود نەیانکردبێت). ووتیان: باشە تۆ چی دەکەیت کە هاوەڵەکانت نەیان کردووە؟**

**ووتی: بەناو (غەطەفان)دا دەگەڕێم و کۆیان دەکەمەوە. ئەوەبوو بەناو(غەطەفان)دا ڕۆشت و کۆی کردنەوەو ئینجا ووتی: (ئەی کۆمەڵی یەهوود. ئەڕۆین بۆ ئەو شوێنەی ماڵی محمدی لێیە چونکە هیچ کەسێك نیە ئەگەر شەڕ لەکەڵ کەسێکی تر بکات لەماڵەکەیدا، ئەوا**

خـاوەن ماڵەكـە ئەگـەر زەرەرێكـی كـەمیش بێـت لێـی دەدات).

ووتیان : بۆچونەكەت زۆر جوانە.

ئەم هەواڵـەی هـاتنی (ئەسیری كوڕی زارم )ی یـەهوودی گەیشـتەوە پێغەبـەر(ﷺ) ئـەویش (خارجـەی كـوڕی سـوهەیل )ئـەم هەواڵـەی دایـە كاتێـك هاتـە مەدینـەو پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لێكرد دەربارەی (خەیبەر)،

ئـەویش ووتـی :كاتێـك مـن ئـەوێم بەجێ هێشـت بینـیم ئەسـیری كـوڕی زارم و چـەند كەتیبەیـەكی یـەهوودی بەرەو ڕووت ئەهاتن.

پێغەمبەری خودا (ﷺ) سـی(٣٠) هـاوەڵی بـانگ كـرد كـە تیایانـدا: (عەبداللـهی كـوڕی ئـەنیس)ی تیـادابوو،وە عەبداللـهی كـوڕی ڕەواحـەی كـردە ئـەمیریان و فـەرمانی پێكـردن كـە بـەرەو ڕووی (ئەسـیری كـوڕی زارم ) بچـن و نەخشـەیەكی بۆدابڕێـژن. تاچـی پـیٚ ئـەڵێن پێـی بڵـێن و پاشان لەناوی بەرن و بیكوژن. چونكە جەنگ بریتیـە لـە فێڵ و پیلان(والحرب خدعه).

عبداللەی کوڕی ئەنیس دەفەرموێت: (...منیان تیابووم و پێغەمبەر(ﷺ) عەبداللەی کوڕی ڕەواحەی کردە فەرماندەمان، دەرچووین لە مەدینە تانزیکی خەیبەر بوینەوە ئەوە بوو یەکێکمان نارد تا بە (ئەسیر) ڕابگەیەنێ: (ئایا ئێمە بێینە ناوەوەو دڵنیابین لێتان ؟ وە ئەو شتەی بۆی هاتووین پێی ڕابگەیەنین ؟).

ووتی: بەڵێ منیش هەر ئەوەم لە ئێوە ئەویَو منیش دڵینابم لە ئێوە ؟

ووتمان: بەڵێ.

چووینە لای و پێمان ووت: (پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئێمەی ناردۆتە لات کەب یێ بۆلای و چاکەت لە گەڵدا بکات و بتکاتە سەرکردەی خەیبەر).

ئەوەبوو تەماع گرتیو مشاوەرەی بە جولەکە کرد بۆ ئەم مەسەلەیە. بەلاّم یەهوود چونەدەرەوەی ئەسیریان بە دڵ نەبوو. ووتیان: (هیچ کات محمد پیاوێك نەکاتە پێشەوا کە لە بەنی ئیسرائیل بێت).

ئەسیر ووتی: با ئەیكات، ئێمە لە شەڕو جەنگ بێتاقەت بووین و شەڕناكەین. ئەوە بوو ئەسیر لەگەڵمان هاتە دەرەوە لە خەیبەر بە (٣٠)سی پیاوی یەهوودییەوە كە لە گەڵیدابوون لەگەڵ هەر یەكێك لەو سی كەسەدا یەكێكمانی لە گەڵ دابوو .....

ئەڕۆیشتین تا گەیشتینە(قرقرة ثبار) -كە شوێنێكە شەش میل لە خەیبەرەوە دورە-لەویادا (ئەسیر)پەشیمان بوویەوەو ڕای گۆڕی و ترسا، هەتا بە جۆرێك لە ناوچەوانیدا بەدیمان ئەكرد. ویستی پەلاماری شمشێرەكەی من بداو دەری بكات. بەڵام بە فێڵەكەیم زانیو تۆزێ پێش كەوتم و لە دڵی خۆمدا ووتم: (ئەتەوێ دەست بوەشێنیو غەدربكەیت ئەی دوژمنی خوا....). ئینجا نزیك بوومەوە لێی تا بزانم چی دەكات.

ئەمجارەش ویستی شمشێرەكەم دەربێنێ. منیش لە ووشترەكەم ژەنیو پێش كەوتم.

ووتم:(ئـەوە کـەس ئـەتوانێت دابـەزێت و تـۆزێ ئاومـان بداتێ بیخۆینەوە)؟

ئـەوەبوو کـەس دانەبـەزی. خـۆم دابـەزیم وئـاوم دا بـە هـەموویان تاهێواشـم کردنـەوە، بینـیم (ئەسیر) بـە تـەنها لەلایەکـدا بەسـەر وولاغەکەیـەوە بـوو. زەفـەرم لێ هێنـاو بەشمشێرەکەم یەك لێدان لێمدا بەشی خـوارەوەی قاچـی پـەڕیو یـەك پارچـە ڕان وقاچـی کەوتـە سـەرزەویو لـە ووشــترەکەی کەوتــە خــوارەوە. لــەو کاتــەدا دارێکــی سـەرلاری پـێ بـوو وەکـو گۆچـان کێشـای بـە سـەرمداو شکاندیو بریندار کردم.

ئینجا ئاوڕمـان دایـەوە بـۆ لای ئـەو(٣٠)سـی کەسـەی کـە لەگەڵیدا بوون، هەموویانمان کوشت جگە لە پیاوێکیان نەبێت بۆمان نـەگیراو ڕای کـرد. کەسیش لـە موسـڵمانان بریندار نەبوون جگە لە من....

پاشان بەرەو لای پێغەمبـەر(ﷺ)گەڕاینـەوە. لـەم کاتـەدا پێغەمبەر(ﷺ)لەناو هاوەڵەکانیدا دانیشـتبوو قسـەی بـۆ

ئەکردن و پێی ووتن: (بابەڕێ کەوین بۆسەر گردەکەو چاوەڕوانی خێرین لە براکانمان).

ئەوانیش لەگەڵیدا دەرچوون بەرەوپیرمان. کاتێ گەیشتنە سەر گردەکە ئێمەیان بەدی کردو ئێمەش گەیشتینە لای هەواڵەکەمان پێدا. ئەویش فەرموی:(نجاکم الله من القوم الظالمین)... خوای گەورە ڕزگاری کردن لە کۆمەڵی ستەم کاران .

منیش لێی نزیك بومەوە تافوی کرد بە برینداریەکەی سەرمدا. دوای ئەوە ئیتر نە برینداری پێوە ما نەتەڕیو خوێن . وەدەستی پیرۆزی هێنا بەسەر دەم وچاومداو بۆم پاڕایەوە...

وەپێغەمبەری خوا(ﷺ)فەرمانی کرد بە هاوەڵەکانی بۆ جەنگ کردن و گرتنی خەیبەر. ئەوەبوو لە مانگی ربیع الاول ی ساڵی(٧)کۆچیدا دەرچوون بەرەو ڕووی(خەیبەر)کە عەبداللهی کوڕی ڕەواحەش لەگەڵ هاوەڵەکاندا بوو. وەشان بەشانی پێغەمبەر(ﷺ) جەنگی دەکردو چواردەوری قەڵایەك لەقەڵاکانی خەیبەریداو

خوای گەورە لەسەر دەستی ڕزگاری کردو گرتیان. پاش جەنگەکـــە پێغەمبـــەر(ﷺ) غەنیمەتەکـــەی بەســـەر هاوەڵەکانــدا دابــەش کــردو بەشــی عەبداللــهی کــوڕی ڕەواحەشی‌داو بەشەکەی هەموو(بەنی الحارث)یشی‌دایە تـــا ئـــەو بەشـــی بکـــات بەســـەری‌یاندا چـــونکە سـەرکردەو(نەقیب)یان بـوو. پاشـان یـەهود داوایـان لـە پێغەمبــەر(ﷺ)کــرد کــە ڕازی بێــت بــەوەی باخــات و بێستانی خورماکەیان بۆ خۆیان بێت و خۆیان خزمـەتی بکـەن بـۆ خۆیـان چـونکە خۆیـان شـارەزاتربوون لـەو بوارەدا.

پێغەمبەریش (ﷺ)ڕازی بوو بەوەی کە (مساقات) بکـەن. واتە: خۆیان خزمەتی بکـەن و ئاوی بدەن وموسڵمانان بەشێکیان بەربکەوێ لـە بـەروبومی ئـەو باخاتـە. وەپێـی وتـن: (بـەوە ڕازی ئـەبم لێتـان کـە خـوای گـەورە ڕازی‌یـە پێی).

پێغەمبــەری خــوا(ﷺ) عبداللــەی کــوڕی ڕەواحــەی لــە مانگی لێکردنەوەی بەری خورماکەدا دەرنارد بۆ لایان

کە بەشـەکەی موسـڵمانانیان لـیٚ بسـتیٚنیٚت. عەبـدالله ش بــە یەهودیـیــەکانی خەیبــەری دەوت: (ئەگــەر ئــارەزوو دەکــەن ئیٚــوە خزمــەتی بکــەن و نیــوەی بەرەکــەی بدەنــە ئیٚمە. وەئەگەر ئارەزوو دەکەن بۆ ئیٚمـە بیٚت و خزمـەتی دەکەین و نیوەی بەرەکەی بـــۆ ئیٚوە).

ئــەوەبوو (٤٠٠٠٠)چـل هــەزار( وەســەق) واتــە: بــاری حوشـتری لــە بەرەکــەی لیٚســەندن، جولەکـە ئـەم بەشــە خورمایــەی بــەلاوە زۆر بـوو لەبەرئـەوە ئـاڵتوون و زیٚـڕی ژنەکانیان کۆکردەوەو بردیان بۆ لای عبدالله و ووتیـان: (ئەی عبدالله ئەمە هەمووی بۆ تۆو ئیتر بەشی بەروبومی خورماکەمان لیٚمەستیٚنن).

عبداللـە ش تـووڕە بـوو ووتــی : ( ئــەی کۆمــەڵی یــەهود. سـویٚند بـەخوا ئیٚـوە خـراپترین کەسـانیٚکن کـە مـن ڕقـم لیٚتانە. بەڵام ئەمە وام لیٚناکات ستەم و زوڵمتان لیٚ بکـەم و ماڵ و سامانتان بخۆم).

ئــەوانیش لــە دڵــی خۆیانــدا ئــەیان ووت .......ئـا بــەم دادپەروەریە ئاسمانەکان و زەوی ڕاگیر بووە.

ئـيتر لـەوەو دوا عبداللـە هـەموو سـاڵێك بەشـەكەی لـێ دەسەندن هەتا لە جەنگی (مؤتـة)دا شەهید بوو خوای لێ ڕازی بێت... هەزاران ڕەحمەت لە گیانی پاكی ئەم هاوڕێیەی پێغەمبەر(ﷺ).

************************

## جڵەوگری حوشترەكە

لـە رێكەوتننامـە (صـوڵح)ی حودەیبیـەدا پێغەمبـەری خـوا(ﷺ)لەگـەڵ موشـركیندا پـەیمانی بەسـت لەسـەر ئەوەی كە بـۆ ماوەی (١٠) سالْ جەنگ ڕوو نەدات لە نێوانیانـداو سـاڵی داهـاتوش دەگەڕێنـەوەو دێنـە نـاو مەككـە بـۆ حـەج و عـەمرەكردن. وە كـاتێ مـانگی ذوالقعـدةی سـاڵی (٧)ی كۆچـی هـات. پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمانی بـە هـاوەڵانی كـرد كـە خۆیـان ئامـادە بكـەن بـۆ سـەفەركردن بـەرەو مەككـەو ئەنجامـدانی حـەج و عەمرەكـەیان. وەفەرمانیشـی كـرد كـە كـەس دوانەكـەوێ

**لەوانـەی کـە سـاڵی ڕابـردوو بەشـداری (حودەیبیـە)یان کردبوو.**

**پێغەمبــەر(ﷺ)هــانی هاوەڵــەکانی دەدا لەســەر مــاڵ بەخشـین لـەپێناوی خـوادا. هـەروەها (ناجیـەی کـوڕی جونــدبی ئەســلەمی )ی خســتە پێشــی کاروانەکـە بـە حوشترەکانەوە کە لەدارستانەکەدا بیان لەوەڕێنێ.**

**پێغەمبــەر(ﷺ) لەگــەڵ خۆیــدا چــەك و تفــاق و ڕم و قـەڵغانی هێنـابوو، وە سـەرۆکایەتی(١٠٠) سـەد ئەسـپ ســواری دەکــردو ئەســپەکانی خســتبووە پێشــەوەو (محمدی کوڕی مەسلەمە)ی کردە بەرپرس و پێشـەوای ئەسـپ سـوارەکان. وە(بەشـیری کـوڕی سـەعد)ی مێـردی (عــەمرەی خوشـکی عبداللــە کــوڕی ڕەواحــە)ی کــردە بەرپرسـی پیادەکـان و ئەوانـەی چـەك و تفاقیـان پێبـوو، لەوکاتەدا هەندێك لـەهاوەڵانی وتیان :(ئەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ)تـۆ چەکت لەگـەڵ خۆتـا هـەڵگرتوە لـە کاتێکـدا ئەوان مەرجیان لەگەڵ کردین کە نابێت بچینە ناویانـەوە**

بــه چــەكەوە مەگـەر چەكی سـەفەر شمشێر بێـت و لـە كێلاندابێت.

ئــەویش فــەرمووی: (ئێمــە بەچــەكەوە ناچــینە نــاو حەرەمـەوە. بـەلاَم لـە نزیكـی خۆمانـەوە دایـدەنێین هـەر كاتێك ویستیان دەست بوەشێنن باچەكەكان لێمانـەوە نزیك بێت).

پێغەمبــەری خــوا(ﷺ) و هاوەڵــەكانی بــەردەوام بــوون لەســەر ڕۆیشــتن و تەلبیــەكردن[١] وەكــاتیٚ گەشــتنە (مرالظهـران) كۆمـەڵێك لـە قورەیشـی‌یەكان ئـەم ئەسـپ سـوارو چـەكانەیان بینـی بەسـەریەوە، بۆیـە پرسـیاریان لە(محمـدی كـوڕی مەسـلەمە)كرد لـەم بارەیـەوە؟ ئـەیش فەرمووی: ئەوە پێغەمبەرە(ﷺ) خۆ گاڵتەذی‌یە، بەیانی لەویٚ ئەكاتەوە.

ئـەم كۆمەڵـەش دەرچـوون و هەواڵەكـەیان بـە قـوڕەیش ڕاگەیاند كە چیان بینبوو لە ئەسپ سوارو چەك باسیان كــرد. قوڕەیشــیش تــرس و لــەرز دایگــرت، پیــاوانی قوڕەیش ووتیان: (ئێمە لەسەر پەیمان و بەڵێنی خۆمان

ماوینەتــەوەو نــەمان شــكاندوە ! دەی باشــە محمــدو هاوەڵەكانی بۆ جەنگمان لەگەڵ دەكەن ؟!

لەبەر ئەمە قورەیش (مكرزی كوڕی حەفص)و كۆمەڵێكی لەگەڵدا نارد بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) لە كاتێكدا كە ئەوان گەیشتبوونە (بطن یأجج) پێیان ووت:

(ئەی محمد ئێمە نە بەمناڵیو نە بە گەورەیی غەدرمان لە تـۆ نـەبینیوە، ئایـا بەچـەكەوە دێیتـە نـاو گەلەكـەت لـە حەرەمـدا ؟؟ لـە كاتێكـدا لـە مەرجـدا بـوو كـە بەچـەكی سەفەرەوە نەبێت نەیەیتە ناوەوە. ئەویش شمشێری ناو كێلان و بەس)

ئـەویش فـەرمووی: (ئێمــە بــەو شــێوەیە نــەبێت نایــنە ناوەوە (واتە لەسەر بەڵێنەكەی خۆمانین)

(مكرز)گەڕایـەوەو هەواڵەكـەی بـە قـورەیش ڕاگەیانـد كـە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەچەكەوە نایەتە ناوەوە. ئەویش لەسەر مەرجەكەی كە خۆی دابووی پێتان).

بــەڵام پیــاوانی یــاخی بــووی قــورەیش مەككــەیان بەجێهێشــت و ســەركەوتنە ســەر بــەرزایی شــاخەكان و

حـەزیان نـەدەکرد کـە تەماشـای موسـڵمانەکان بکـەن لـەکاتی تـەواف کردنیانـدا بـەدەوری کەعبـەدا.. وە پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمانی کـرد کـە وولاّخـەکان لـە (ذي الطوى) ببەسترێتەوە.

پێغەمبـەر(ﷺ) چـووە نـاو مەککـەوە بەسـواری حوشترەکەیەوە کە ناوی (القصواء) بوو، وە هاوەڵەکانی لەچـوار دەوریـەوە دەڕۆیشـتن و شمشـێریان لـەکێلان هـەڵگرتبوو وە تەلبیـەیان دەکـرد. کـاتێ گەیشـتنە (ذی الطـوى) وەسـتا بەسـەر حوشـترەکەیەوە موسـڵمانانیش بەچـوار دەوریـەوە، پاشـان لـەو بەرزاییـەوە چـووە ژورەکەوە ئەیڕوانی بەسەر چوار دەوری مەککەدا.

عبداللـە ی کـوڕی ڕواحـەش جڵـەوی حوشـترەکەی پێغەمبـەری(ﷺ) گرتبـوو هـەتا چـووە نـاوەوەو بەسـەر حوشـترەکەیەوە بـە چـواردەوری کەعبـەدا سـوڕایەوەو تەوافی کرد، هەتا گۆچانەکەیدا لە(روکن) واتە گۆشـەی کەعبـەی پـیرۆز. وەلـەم کاتـەدا عبداللـە ش شـیعری دەهۆنیەوەو دەیفەرموو:

**خلوا بني الكــفار عن سبيلـه**

**خلوا فكـل الخيـر في رسوله**

**يارب اني مـؤمن بقيـلـه**

**اعرف حـق اللـه في قبولـه**

**نحن قتلناكم علـى تأويـلـه**

**كماضربنـاكـم على تنزيـلـه**

**ضربا يزيـل الهام عن مقيلـه**

**ويذهل الخيـل عن خليلـه**

**پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) دەســتی ڕاســتی لــە (ئیحرامەکەوە)واتە لەپۆشاکی حەج کردنەوە دەرهێنابوو واتــە قــۆڵی موبــارەکی ڕووت بــوو. وەبــە هاوەڵــەکانی فەرموو: (اضـطبعوا وارملـوا ورحـم الله امـرأ أراهـم اليـوم قـوة مـن نفسـه). واتــە: وەکـومن دەسـتان دەربهێـنن و شانتان ڕووت بکەن دابمەزرێن ڕەحمەتی خوا لەوکەسە بێت کـە ئیمڕۆ هێزی خۆی نیشانی ئەوان ئەدات.**

**پاشان لەحوشترەکە دابەزی و بــۆ جاری دووەم تـەوافی کرد بەچواردەوری کـەعبەدا. پاشان خۆی و هاوەڵەکانی**

سـێ جـار بـەڕاکردن بەصـەفاو مـەڕوادا ڕایـان کـردو جارەکانی تریش بە هێواشی دەهاتن و دەچوون، پاشان دۆلکەیەك ئاویان له ئاوی زەمزەم بۆ هێناو ئەویش لێی خواردەوەو دەموچاوی پیرۆزی پێ شت. هاوەڵانیش پاڵەپەستۆیان بوو بۆ ئەوەی لەو ئاوەی کە لە دەم وچاوی دێتە خوارەوە بەریان بکەوێت و بە لەشیاندا بهێنن لەبەر پیرۆزی.

وەکاتی نیوەڕۆش فەرمانی بەبیلال کرد سەرکەوێتە سەر کەعبەو بانگی نیوەڕۆ بلێت. پێغەمبەر(ﷺ) سێ ڕۆژ مایەوە لەمەککەداو دوایی گەڕایەوە بەرەو مەدینە.

## کوڕی ئیمانی

عبداللەی کوڕی ڕەواحە ڕەزای خوای لێ بێت زۆر پێغەمبەری(ﷺ) خۆشدەویست و گوێڕایەڵی دەکردو فەرمانەکانیو داواکاریەکانی بەجێ دەهێناو بە ڕۆح و ماڵ دەبووە فیدای، وەهەتا بڵێی دامەزراو بوو لەسەر گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەری خوا(ﷺ). ڕۆژێکیان

عبدالله ئەهات بەرەو مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) و بینی کە هاوەڵەکان کۆبوونەتەوەو پێغەمبەر (ﷺ)ووتاریان بۆدەدات، پێش ئەوەی بچێتە ناو مزگەوت گوێی لێبوو پێغەمبەر(ﷺ) بەهاوەڵەکانی فەرموو: ( دابنیشن ).

عبدالله لەدەرەوەی مزگەوت بوو لەلای دەرگاکەوە نەهاتە ژوورەوەو ئەو چەند هەنگاوەی نەنا هەتا بچێتە ژوورەوەو پاشان دابنیشێ، چونکە درەنگ خایەنێکە بۆ بەجێهێنانی فەرمانەکەی پێغەمبەر(ﷺ). بۆیە لە دەرەوە دانیشت و گوێی لە ووتارەکە دەگرت هەتا پێغەمبەر (ﷺ) لە ووتارەکەی بوویەوە .........

بەڵێ .... ئازیزەکانم ئێوە بیستبوتان کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ ﴿..ومن یطع الله ورسوله فقد فازفوزا عظیما........﴾. بۆیە هەڵپەتان دەکرد بۆ ئەو بردنەوە گەورەیە.

بەلاّم توخوا ئێمەی داماوو سەرکز چی بکەین و چۆن ڕومان بێت بڵێین شوێنی قورئان کەوتوین و کەچی وەك ئێوە ناتوانین کار بکەین بە قورئان ..

ئـەم هەواڵـە گەیشـتـەوە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) بۆیـە زۆر شادمان بـوو سوپاسـی کـرد لەسـەر ئـەوکارەو پاڕایـەوە لەخوای گەورە بۆیو فەرمووی: (( زادك الله حرصا علـى طواعیـة الله وطواعیـة رسولــه)). واتـە: خـوای گـەورە دامــەزراویت زیادبکــات لەســەر گوێڕایــەڵی خـــواو گوێڕایەڵی پێغەمبەر(ﷺ).

وەیـــەکێکی تــر لـــە خۆشەویســـتییەکانی بــــۆ پێغەمبـەر(ﷺ) ئـەوە بـوو گـوێی لـە پێغەمبـەر(ﷺ)بـوو دوای تـەواوبونی جـەنگی ئوحـود دەیفـەرموو: (( لکـن حمزة لابواكي لە)). واتە:بەڵام حەمزە کەس بۆی ناگریی و کەسی نیە. ئەمەش پێغەمبەر(ﷺ)کاتێك فەرمووی کـە بەلای ماڵی ئەنصارەکاندا دەرۆیشت و گوێی لـە گریـانی ئافرەتەکانی شەهیدەکان بوو.

عبداللـەی کوڕی ڕواحـە ڕۆیشـت بۆلای (بـەنی حاریسـی کـوڕی خـەزرەج )و هـەموو ئافرەتـەکانیانی کۆکردنـەوەو بردنی بۆماڵی پێغەمبەر(ﷺ)هەتا بۆ حەمزەی سـەرداری شـەهیدان بگـرین. هـەروەها (سـەعدی کـوڕی موعـاز)یش

هـــەمان كـــاری كـــردو ئافرەتـــانی (بـــەنی عبدالاشـــهل)ی لە(ئەوس)كۆكردەوە. كاتێك پێغەمبەر(ﷺ) ئەمەی بینـی فـــەرمووی: ((مـــا أردت هـــذا، ارجعـــن مـــأجورات غـــیر مـــوزورات، یـــرحمكن اللّٰە)).واتـــە: ئـــەی ئافرەتـــەكان مـــن ئەمـــــەم نەدەویســـــت، بگەڕێنـــــەوە بەپاداشـــــتەوە تـــــا گوناهبارنـــەبوون. خـــوا لێتـــان ڕازی بێـــت و ڕەحمتـــان پێبكـات. وەزۆر بـە تونـدی نـەهی لێكـردن لـە گریـان و لاوانەوە بۆ شەهیدان.

عبداللەی كوڕی ڕەواحە سوارچاكێكی ئازاو پاڵـەوانێكی جەربەزەبوو وەعادەتی وابوو خوالێی ڕازی بێت هـەردەم یەكـەم كـەس دەبـوو كـە دەردەچـوو بـۆ جـەنگ و جیهـاد كاتێـك پێغەمبـەر(ﷺ)بـانگی بكردنایـە. وەئـەخیر كـەس بـــوو كـــە دەگەڕایـــەوە لەجـــەنگ. وەهـــەردەم لـــە زیكركردنـــدابوو، وە زۆر قورئـــانی دەخوێنـــدو دڵـــی ئـــاڵودەی مزگـــەوت بـــوو، وای لێهـــاتبوو لێـــی جیـــا نەدەبووەوەو نەدەچووە دەرەوە.

وەبەناوبانگ بوو بەسیفەتی ئەوەوە کە لەناو هاوەڵەکانی پێغەمبەردا(ﷺ)خۆشی دەویستن و خۆشیان دەویست، وەهــانی دەدان لەســەر زیکــری خــواکردن و پەشــیمان بوونەوە لەتاوان.

(ابوالــدرداء)عبــدالله ی زۆرخــۆش دەویســت و عبــدالله زۆرکـاری کردبـوە سـەری کـە ئـەم خـاڵۆزای عبـدالله یـە. ئەبودەردا دەفەرموێت: (پەنائەگرم بەخوا کە ڕۆژێك بێـت بەســەرمدا کــە خۆشەویســتی عبداللــەم لەبیربچــێتەوە. ئەگەر بەرەو ڕوم بهاتبایە لەسەر ڕێگا، دەی کێشا بەسەر سنگمدا. وەئەگەر لەپشتمەوە پێم بگەشتایە ئەیکێشابە ناوشــانمداو ئــەیوت: (یــاعویمر اجلــس بنــا نــؤمن ساعة)واتە:ئـەی عـوەیمر دانیشـە باساتێك ئیمـان تـازە بکەینەوە). ئیتر ئەوەبوو دادەنیشتین.

هــەتا خــوا بیویســتایە یــادی خوامــان دەکــرد. پاشــان دەیوت: ئەی عوەیمر. ئەمە کۆڕی ئیمانی‌یە).

خێزانەکەشـی دەڵێت:(عبداللـه هـەرگیز لـەماڵ نەچـۆتە دەرەوە مەگـەر دوو رکـات نوێـژی کـردووە. وەهـەرگیز نەگەڕاوەتەوە بۆماڵەوە مەگەر دوو ڕکاتی کردووە).
عبدالله نەخۆش کەوت و لەناو جێگەدا لەماڵەوە مایـەوە. پیغەمبـــەری خـــوا(ﷺ)ســـەردانی دەکـــرد لـــەکاتی نەخۆشـــیەیەکەیدا. ئـــەوەبوو لـــەو کاتـــەدا کـــە پیغەمبەر(ﷺ)لەلای سەری یەوە دانیشتبوو(عبدالله)زۆر نەخۆشـیەیەکەی گـران بـوو بـوو چـاوەکانی نوقـا. پیغەمبەریش(ﷺ)دوعای بۆکردو فەرموی: (اللهم ان كان قـد حضـر اجلـه فيسـر عليـه، وان لم يكـن حضـر اجلـه فاشفه).
واتە:ئەی پـەروەردگار ئەگـەر ئەجـەلی نزیـك هـاتووە ئـەوا ئاسـانی بکـە لەسـەری، وەئەگـەر ئەجـەلی دوورە شـیفای بدە.
ئەوەبوو عبدالله هەڵسایەوەو هۆشی هاتەوە سەرخۆی و لەشـــی ســـوك بـــوو لـــە نەخۆشـــیەکەیو ئـــەوەبوو

هەستايەوەوچاك بويـەوە بـە هـۆی پـيرۆزی پاڕانەوەكـەی پيغەمبەری خوا(ﷺ).

ڕەزای خـــوا لەســـەر بـــاوكی محمــد-عبداللـــەی كـــوڕی ڕەواحە-بێت و خوا پاداشتی خێری بداتەوە.

***************************

## شەهيدی جەنگی موئتە

لــــە مــــانگی جـــەمادی الاول ی ســــاڵی(٨)ی كۆچـــی پێغەمبەر(ﷺ) لەشكرەكەی نارد بەرەو(موئتـە)و (زەيـدی كوڕی حارثة)ی كردە سەركردەی لەشكرەكەو فەرموی: (ئەگــەر ئــەم كــوژرا باجەعفــەری كــوڕی ابوطالــب بێتــە جێگـەی. ئەگـەر جەعفـەريش كـوژرا بـا عبداللـەی كـوڕی ڕەواحە بچێتە جێگەی).

خــەڵكی خۆيــان ئامــادەكرد بــۆ هێــرش بــردن و ســازو ئامادەبــاش بـــوون- وەژمارەيــان(٣٠٠٠)ســـێ هـــەزار جەنگاوەر بوون. لە كاتێكدا كە خەڵكی خوا حافيزيان لە لەشـــكرەكەو ســـەركردەكانی دەكرد(عبداللـــەی كـــوڕی

ڕەواحە) دەستی کردە گریان. ووتیان: ئەی باوکی محمد بۆچی ئەگریت؟!
فەرمووی: سوێند بەخوا لەبەر خۆشەویستی دونیاو دوورکەوتنەوەم لە ئێوە ناگریم. بەڵام گوێم لێ بوو پێغەمبەر(ﷺ)ئایەتێکی لە قورئانەکەی خوادا دەخوێندەوە کە باسی ئاگری دۆزەخی تیادابوو دەیفەرموو:﴿وان منكم الا واردها كان على ربك حتما مقضيا﴾
واتە: هەریەك لە ئێوە دەبێ پیایدا تێپەڕبێ- واتەبەسەر پشتی دۆزەخدا لەسەر پردی صیراطة- ئەمە ئەمری خوایەو بڕیاری لەسەردراوە. جا منیش نازانم چۆن دەرباز ببم دوای ئەوەی کەوتمە سەری).
موسڵمانان ووتیان: (خواتان لەگەڵ بێت و ناخۆشیتان لەسەر لاباو بەسەلامەتی بتانگێڕێتەوە بۆ ناومان).
عبداللەش کە گوێی لێیان بوو بەشیعرەوە فەرمووی:
لكنني اسأل الرحمن مغفرة
وضربة ذات فرع تقذف الزندا

او طعنة بيدى حران مجهزة

بحربة تنفذ الاحشاء  والكبدا

حتى يقال اذا مروا على جدثي

يا ارشد الله من غاز وقد رشدا

لەشکرەکە دەستی بە ڕۆشتن کرد. عبداللەش پێش کەوت و سڵاوی لەپێغەمبەر(ﷺ)کردو چەند بەیتە شیعرێکی بۆ هۆنییەوە کە تیایدا خوا حافیزی لێ دەکرد. پێغەمبەریش(ﷺ)دوعای خێری بۆکردو عبدالله لەگەڵ لەشکرەکەدا کەوتەڕێ و جار جار ئاوڕی دەدایەوە بۆ دواوەو سەیرێکی پێغەمبەری(ﷺ)دەکرد بۆ ئەوەی تێربێت بە بینینی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، وەلەگەڵ خۆیدا دەیفەرموو:

خلف السلام على امرىء  ودعته

في النخل خير مشيع وخليل.

دواتر بەردەوام بون لە ڕۆیشتن تا گەیشتنە(معان) لە زەوی شام و لەوێدا دابەزین. هەواڵ گەیشتە خەڵکەکە کەوا(هرقل) لە(مآب)دا دابەزیوە لە

زەوی(البلقان)بـــە(١٠٠٠٠٠)ســـەد هـــەزار ڕۆمـــەوە!.

هەروەها زۆرێك لە عەرەبەكان كە زیاد لە(١٠٠٠٠٠)سەد هـەزار دەبـن پاڵیـان داوە پێوەی لـە(لخم وجـزام والقین)و هۆزی تر. وەبونەتە(٢٠٠٠٠٠)دووسەدهەزار!!

موسڵمانان لـە(معان) مانـەوە كـە ژمارەیـان(٣٠٠٠) بـوو، وەبیریان لەچارەسەرێك دەكردەوە كە ئایا باشە چی بكەن؟!

هەنـــدێكیان ووتیـــان: نامەیـــەك دەنوســـین بـــۆ پێغەمبەرو(ﷺ)هەواڵەكەمانی پێ ڕادەگەیەنین و ژمارەی دوژمنیشـی پـێ دەڵـێین. یـان ئـەوەتا یارمـەتیمان بـۆ دەنێـرێ لـەپیاوان یـان فـەرمانمان پـێ دەكـات بەشـتێك و ئەنجامی دەگەیەنین.

بـەڵام عبداللـەی كـوڕی ڕەواحـە پـێش كـەوت و وورەی موسـڵمانانی بـەرزكردەوەو فـەرمووی: (ئـەی خزمـان.. سوێند بەخوا ئەوەی كە ئێوە پێتان ناخۆشە ئێستا هـەر ئەوەیـە پـاڵی بـە ئێـوەوە نـاوەو ئێـوەی ناردۆتـە دەرەوە بۆی كەشەهیدییە. ئێمەش شەڕناكەین بە ژمـارەو هێـزو

زۆری. بەڵکو شەڕیان لەگەڵ ناکەین تەنها بەم ئاینە نەبێ کەخوای گەورە ڕێزدارو سەربەرزی کردوین پێی. هەریەکێکمان لەم دوو پاداشتە گەورەیەی دەست دەکەوێ....یان سەرکەوتن....یان شەهیدی).

موسڵمانان وەکو شمشێر بەعەزم و وورەیەکی پۆڵاینەوە پێش کەوتن هەتا گەیشتنە لەشکرەکەی(هرقل) لە گوندی (مشارف) لە (البلقان)، پاشان دوژمن دابەزی بەرەو خوار تا موسڵمانان گەیشتن پێیان لە گوندی (موئتە).

موسڵمانان تێك ڕژان لەگەڵ ڕۆم داو جەنگ دەستی پێکرد. (زەیدی کوڕی حارثة)ئاڵاکەی پێغەمبەری(ﷺ)هەڵگرتبوو وە شەڕی دەکرد هەتا شەهیدبوو کەوت بەهۆی ڕمێکەوە کە لێیدا.

جەعفەری کوڕی أبی طالب ئاڵاکەی گرتوو بەردەوام بوو لە شەڕ هەتا شەڕ گەرم بوو. ئەوە بوو ئەسپەکەی گلاو کەوتە خوارەوە. ئینجا بە پێوە شەڕی دەکردو هەتا ئەمیش دەستی ڕاستی پەڕی پاشان ئاڵاکەی بە دەستی

چـەپی گـرت تائەویشـیان پەڕانـد. پاشـان کـۆڵی نـەداو ئاڵاکـەی دینـی خـوای بەهـەردو قـۆڵی کـە نیـوەی مـابوو گرت و نابوی بەسەرسنگی‌یەوە ئەیفەرموو:

یاحبذا الجنة واقترابها

طيبة و بارد شرابها

والروم روم قد دنا عذابها

كافرة بعيدة أنسابها

عَلي ان لاقيتها ضرابها

بەردەوام بوو هەتا شەهید بوو.....

الله اکبر...اللـه اکبر... ئەوانـە پیـاوی ڕۆژی مەردایـەتین، لەموسڵمانانـدا پیاوهەن ڕاستگۆن بەرامبەر پەیمانەکەیان کە دایان بەخوای خۆیان؟...ئەوە ئائەمانەن.

عبدالله ی کوڕی ڕەواحـە پـێش کـەوت و ئاڵاکـەی گـرت، بەسـەر ئەسـپەکەیەوە بـوو دابـەزی و بـەپێ دەڕۆیشـت و لەگەڵ خۆی‌دا قسەی دەکرد دەیفەرموو:

أقسمت يانفس لتنزلنه

لتنزلن او لتكرهنه

ان اجلب الناس وشدوا الرنه

مالي اراك تكرهين الجنة

قد طالما قد كنت مطمئنة

هل انت الا نطفة فى شنة

ئينجا ئەيفەرموو:

يانفس ان لا تقتلي تموتي

هذا حمام الموت قد سقيت

وما تمنيت فقد اعطيت

أن تفعلى فعلهما هديت

ئەيويست وەكو زەيدو جەعفەر بكات. تا كەوتە ناو لەشكرى ڕۆمەوە، ئەو ڕۆژە تا ئێوارە وەك و شێرى جەربەزە شەڕى دەكردو دەجەنگا. ئەوە بوو ئامۆزايەكى پارچەيەك ئێسقانى بۆ برد كە تۆزێك گۆشتى پێوە بوو. ووتى: ئەى عبدالله ئەمە بگرەو بيخۆ با تۆزێ وورەو وزەت تىٚ بێت چونكە ئەمڕۆ بەڕاستى هيلاك بوويت. سەربازانى ئيسلامى بۆ خوا ژياو كەى زانيويانە هيلاكى چىيە؟

**عبدالله ئێسقانەکەی گرت و مژی تا ئەوەبوو گویێی لە قریشکەو تەکبیری موجاهیدەکان بوو لە گۆڕەپانی جەنگدا. ئێسقانەکەی فڕێ داو بەخۆی ووت: .......تۆش لە دونیا ناکەویت و لە دونیادایت.**

**ئـــەوەبوو پـــێش کـــەوت و ئاڵاکـــەی هەڵگرتـــەوە بـــە دەســـتێکیو بەدەســـتەکەی تریشـــی شـــەڕی دەکـــرد تائـەوەبوو بـە شـەهیدی سـەری نایـەوە خـوا لێـی ڕازی بێت.**

**لەگەڵ شـەهیدبوونی عبـدالله موسـڵمانان شـپرزە بـوون و کاریان تێك چوو چونکە ئێستا سەرکردەیان نەما.**

**ئـەوەبوو (ثابـت ی کـوڕی ئـةقرةم)ڕای کـردوو ئاڵاکـەی پێغەمبـەری (ﷺ)هـەڵگرت و موسـڵمانانی کـۆی کـردەوە لەچواردەوری پاشان(ثابت)هاواری کرد:-**

**(...موســڵمانان...پیاوێك هەڵبــژێرن لـــە خۆتـــان بـــۆ ئەمیری...).**

**ووتیان: تۆ..**

ثابت ئاوڕی دایەوەو(خالیدی کوڕی وەلیدی)بینی. کە وەکو شێر چاوی ئاگری ئەکردەوە بانگی کردوو ئاڵاکەیدایە.

خالید ووتی: تۆ لە من باشتری بیگرە. چونکە تۆ زووتر گەیشتیتە سەری.

ثابت دایەوەو ووتی: هەڵیگرە خالید. تۆ شارەزاتری لەجەنگ وەك لە من.

ئەوەبوو خالید وەری گرت و بەرزی کردەوەو دەستی کرد بە شەڕکردن و دیفاع کردن لەموسڵمانان هەتا موسڵمانانی ڕزگار کرد لەدەستی دوژن و هەموو موسڵمانانی لەوێ دەرباز کرد.

کاتێك خالید خەڵکەکەی لە دەستی دوژمن دەرکردو لەشەڕەکەی دوورخستنەوە. بەرەو مەدینە ڕێیان گرتە بەر.

کاتێك لەبەرزایەکانەوە دابەزین پێغەمبەر(ﷺ)و موسڵمانان بەرەو پیریان هاتن. منداڵەکان بەتووڕەیو قسەپێ ووتنەوە. پێغەمبەری خواش(ﷺ)بەسەر

ووشــترەکەیەوە بــوو فــەرمووی:... منداڵــەکان بگــرن و هــەڵیان بگــرن و کوڕەکــەی جەعفــەرم بدەنیٚ...ئــەوەبوو عبداللّه ی  کوری جەعفەریان دایەو هـەڵی گـرت وسـواری کردو لەبەردەمیدا داینا.

خەڵکەکـە خۆڵیـان دەکـرد بەسـەرو چـاوی لەشـکرەکەداو پێیان دەوتن: (یافرار، فررتم من سبیل اللە)

واتە:ئـەی پشـت هەڵکـەرەکان. لەجـەنگی پێنـاوی خـوادا پشتان هەڵکردوو ڕاتان کرد.

پێغەمبەریش(ﷺ) بێدەنگی کردن و دەیفەرموو:

((لیسوا بالفرار. ولکنهم الکرار ان شاءاللە)).

واتە:ڕایان نەکردوە. بەڵکو خۆیـان مـەلاس داوە بۆشـالاو بردنەوە ان شاء اللە.

پاشــــان  پێغەمبــــەری خــــوا(ﷺ) بەســــەرهاتی جەنگەکەی(موئتــە)ی بـۆ هاوەڵـەکانی بـاس کـرد لەسـەر مینبــەرو هـــەواڵی شــەهیدبوونی ســەرکردەکانی پــیٚ ڕاگەیانــدن،  وە هـــەواڵی دانــیٚ کە(زەیــدی کــوڕی حارثـة)لەبەهەشـتدایە. وەهەروەها(جەعفـەری کـوڕی ابـي

طالب)خوای گەورە دەستەکانی بۆ گۆڕیوە بە دووباڵ کە بە هۆیەوە دەفرێ بەناو بەهەشتدا. بۆیە ناوی دەبرد بە(جعفر الطائر)واتە: جەعفەری باڵدار.
وە پێغەمبەر(ﷺ)هەواڵی دانێ کە قەرەوێڵەوپێخەفەکەی عبداللەی کوڕی ڕەواحە لەبەهەشتدایە. بەڵام لایەکی قاچەکانی خوراوە ئەوەش لەبەر ئەوەی دوودڵی ڕووی تێ کرد لەکاتی شەهیدبوونی دوو هاوەڵەکەیدا کە (زەیدو جەعفەرن).

ڕەزای خوا لەهەموویان بێت

وآخر دعوانا ان الحمدلله رب العالمين

تێبینی:ئەم نوسراوە نامیلکەیە لە نامیلەکەی (ابطال من الانصار)ی- وليد الاعظمي- وەرگێردراوە بەدەستکاریەکی کەم و پێویستەوە...

وەرگێڕ..

# سەرچاوەکان


١- السيرة النبوية- ابن هشام.

٢- المغازى. -الواقدى.

٣- الطبقات- ابن سعد.

٤-صحيح البخاري- البخاري.

٥-الاستيعاب- ابن عبد البر.

٦-حلية اللأولياء - ابو نعيم الاصبهانى.

٧-الروض الانف- السهيلى.

٨-صفة الصفوة- ابن الجوزي.

٩-اسد الغابة- ابن الاثير.

١٠-الكامل في تأريخ- ابن الاثير.

١١-السيرة النبوية- ابن كثير.

١٢-الاصابة- ابن حجر العسقلانى.

١٣-امتاع الاسماع -المقريزي